## وانەی نۆزدەیەم

## شەددە (ـــّـ)

هەرکاتێك یەکێك لە پیتەکانی زمانی عەرەبی سەددە (ـــّـ)ی هاتە سەر، ئەوا پێی دەڵێن (مشدد) بە کوردی پێی دەڵێن (شەددەدار)، پیتەکە بەتووندی دەردەبڕیت. هەموو پیتێکی شەددەدار پێکهاتووە لە دوو پیت لەهەمان ڕەگەزی ئەو پیتەی کە شەددەی لەسەرە: یەکەمیان ساکن (زدنەدار) + دووەمیان موتەحەریک (جووڵەدار)ە.

نمونە: نَّ پێکهاتووە لە نْ نُ = نْنُ.

شێوازی خوێندنەوەکەی بەم جۆرە دەبێت: نمونە: نَّ دەڵێین: نون شەددە فەتحە ننە یان: نون شەددە سەر ننە.

تێکل (تێبوو): ـّـ

أَبَّ
ئەلیف فەتحە ئە با شەددە فەتحە بە = ئەببە
ئەلیف سەر ئە با شەددە سەر بە = ئەببە

أَبِّ
ئەلیف فەتحە ئە با شەددە کەسرە بی = ئەببی
ئەلیف سەر ئە با شەددە ژێر بی = ئەببی

أَبُّ
ئەلیف فەتحە ئە با شەددە ضەممە بو = ئەببو
ئەلیف سەر ئە با شەددە بۆر بو = ئەببو

أَتَّ أَتِّ أَتُّ
ئەتتە ئەتتی ئەتتو

أَثَّ أَثِّ أَثُّ
ئەثثە ئەثثی ئەثثو

أَجَّ أَجِّ أَجُّ
ئەججە ئەججی ئەججو

أَحَّ أَحِّ أَحُّ
ئەححە ئەححی ئەححو

أَخَّ أَخِّ أَخُّ
ئەخخە ئەخخی ئەخخو

أَدَّ أَدِّ أَدُّ
ئەددە ئەددی ئەددو

أَذَّ أَذِّ أَذُّ
ئەذذە ئەذذی ئەذذو

أَرَّ أَرِّ أَرُّ
ئەڕڕە ئەڕڕی ئەڕڕو

أَزَّ أَزِّ أَزُّ
ئەززە ئەززی ئەززو

أَسَّ أَسِّ أَسُّ
ئەسسە ئەسسی ئەسسو

أَشَّ أَشِّ أَشُّ
ئەششە ئەششی ئەششو

أَصَّ أَصِّ أَصُّ
ئەصصە ئەصصی ئەصصو

أَضَّ أَضِّ أَضُّ
ئەضضە ئەضضی ئەضضو

أَطَّ أَطِّ أَطُّ    أَظَّ أَظِّ أَظُّ    أَعَّ أَعِّ أَعُّ    أَغَّ أَغِّ أَغُّ

ئەططە ئەططی ئەططو    ئەظظە ئەظظی ئەظظو    ئەععە ئەععی ئەععو    ئەغغە ئەغغی ئەغعو

أَفَّ أَفِّ أَفُّ    أَقَّ أَقِّ أَقُّ    أَكَّ أَكِّ أَكُّ    أَلَّ أَلِّ أَلُّ

ئەففە ئەففی ئەففو    ئەققە ئەققی ئەققو    ئەککە ئەککی ئەککو    ئەللە ئەللی ئەللو

أَمَّ أَمِّ أَمُّ    أَنَّ أَنِّ أَنُّ    أَهَّ أَهِّ أَهُّ    أَوَّ أَوِّ أَوُّ

ئەممە ئەممی ئەممو    ئەننە ئەننی ئەننو    ئەههە ئەههی ئەههو    ئەووە ئەووی ئەووو

أَيَّ أَيِّ أَيُّ

ئەییە ئەییی ئەییو

**نمونه بۆ شەددە(ـــّـ) له وشەدا**

بەم جۆرە دەیخوێنینەوە: نمونە:(رَبُّكَ) دەڵێین: ڕا فەتحە ڕە، با شەددە ضەممە بوو، ڕە ببو، کاف فەتحە کە = ڕە ببو کە = ڕەببوکە. یان: ڕا سەر ڕە، با شەددە بۆر بوو، ڕە ببو، کاف سەر کە= ڕە ببو کە= ڕەببوکە

وَتَّبَ    لِلْمُتَّقِينَ    فُجِّرَتْ    وَأَخَّرَتْ    وَدَّعَكَ    كَذَّبَ

كَرَّةٌ    مُكَرَّمَةٍ    تَنَزَّلُ    يَسَّرَهُ    فَبَشِّرْهُمْ    وَحُصِّلَ

يَحُضُّ    تَطَّلِعُ    يَدُعُّ    فَيُعَذِّبُهُ    فَعَّالٌ    تَنَفَّسَ

**پرسیار و ڕاهێنان دەربارەی شەددە (ـــّـ)**

پ/ ئەم وشانە چۆن دەخوێندرێنەوە؟

وَجَنَّاتٍ    فَصَبَّ    فَقَدَّرَهُ    ثُوِّبَ

پ/ (نَّ) لەچی پێکهاتووە؟

و/ پێکهاتووە لە ............ و..............

# وانەی بیستەم

## هەمزەی بەیەکگەیاندن (همزة الوصل)

تێبینی// هەمیشە هەمزەی بەیەکگەیاندن لەسەرەتادا دەخوێندرێتەوە و لە گەیاندندا ناخوێندرێتەوە.

١- هەرکاتێک لەگەڵ پیتی(لام) هات و لەسەرەتاوە هات ئەوا بە (أَ) دەخوێندرێتەوە.

نمونە: ٱللَّهُ ٱلْإِنسَٰنَ ٱلَّذِينَ ٱلْجِبَالُ

بە: (ئەڵڵاهو) (ئەلئینسانە) (ئەللەذینە) (ئەلجیبالو) دەخوێندرێنەوە.

- بەڵام ئەگەرچی لەگەڵ پیتی(لام)یش هاتبێت، لەکاتی گەیاندندا (لە ناوەڕاستدا) ناخوێندرێتەوە.

نمونە: وَٱللَّهُ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ إِنَّ ٱلَّذِينَ وَإِذَا ٱلْجِبَالُ

بە: (وەڵڵاهو) (ئیننەلئینسانە) (ئیننەللەذینە) (وەئیذەلجیبالو) دەخوێندرێنەوە.

٢- هەرکاتێک لەگەڵ پیتی (لام) نەهاتبوو، ویستت بە(هەمزەی بەیەکگەیاندن) دەست بە خوێندنەوە بکەیت ئەوا بە یەکێک لەم سێ شێوەیە دەیخوێنینەوە:

أ- ئەگەر وشەکە (کار) بوو و پیتی سێیەمی (بۆر) بوو ئەوا هەمزەی بەیەکگەیاندن بە (بۆر) واتا بە (أُ) دەخوێنینەوە.

نمونە: ٱدْعُ ٱنظُرْ ٱرْكُضْ

بە: (ئودعو) (ئونظوڕ) (ئورکوض) دەخوێندرێنەوە.

تێبینی// ئەگەر پیتی سێیەمی وشەکە ضەممە (بۆر)یش بێت، بەڵام ئیسم (ناوێک) لەدوای وشەکەوە هات، ئەوا هەمزەی وەصڵ (هەمزەی بەیەکگەیاندن) بە (أُ) ناخوێندرێتەوە، بەڵکو بە (إِ) دەخوێندرێتەوە. نمونە: ٱبْنُ مَرْيَمَ بە: إِبْنُ مَرْيَمَ دەخوێندرێتەوە.

ب- ئەگەر وشەكە پیتی سێیەمی (ژێر) بوو ئەوا هەمزەی بەیەكگەیاندن بە (ژێر) واتا بە (إِ) دەخوێنینەوە.

نمونە: اُصْبِرْ اُكْشِفْ

بە: (ئیصبیر) (ئیكشیف) دەخوێندرێنەوە.

ج- ئەگەر وشەكە پیتی سێیەمی (سەر) بوو ئەوا هەمزەی بەیەكگەیاندن بە (ژێر) واتا بە (إِ) دەخوێنینەوە.

نمونە: اُتَّقَوْا اُسْتَغْفِرْ

بە: (ئیتتەقەو) (ئیستەغفیر) دەخوێندرێنەوە.

تێبینی// هەمزەی گەیاندن: ئەلیفێكە و هێمای (سەری صاد)ێكی بچووكی لەسەرە، وەک لە وێنەكەدا دیارە.

تێبینی// ئەم بابەتە پێویستە زیاتر ڕوون بكرێتەوە، بەڵام بۆ ئاستی سەرەتا ئەوەندە بزانێ بەسە.



## وانەی بیست و یەکەم

## لامی قەمەری و لامی شەمسی

### ١- لامی قەمەری




ئەو لامەیە کە دەنووسرێت و دەخوێندرێتەوە و لامەکە هەمیشە هێمای سکونی لەسەرە و ئەو پیتەی لە پاش لامەکە دێت شەدەی نییە.

- هەرکاتێک یەکێک لەم پیتانەی خوارەوە بە دوای (لام)دا هات، ئەوا (لام)ەکە دەخوێندرێتەوە.
[ أ، ب، ج، ح، خ، ع، غ، ف، ق، ك، م، هـ، و، ي ].

- بۆیە پێی دەڵێن قەمەری، چونکە وەکو لامی وشەی (الْقَمَر) دەخوێندرێتەوە.

نمونە: الْقَمَرِ بە (ئەلقەمەرِ) دەخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر وشەیەک یان پیتێکی لەپێشەوە هات ئەوا هەمزەی وەسڵ (گەیاندن) ناخوێندرێتەوە، بەڵام لامەکە دەخوێندرێتەوە.

نمونە: وَالْقَمَرِ بە (وەلقەمەرِ) دەخوێندرێتەوە.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| الْقَمَرِ | الْقُرْآنُ | الْأَبْتَرُ | الْبَيْتِ | الْجِبَالَ |
| الْحَطَبِ | الْحَرِيقِ | الْخَنَّاسِ | الْعَالَمِينَ | الْعَظِيمِ |
| الْغَفُورُ | الْفَتْحُ | الْكَافِرُونَ | الْكَوْثَرَ | الْمِسْكِينِ |
| الْمَاعُونَ | بِالْهَزْلِ | الْوُحُوشُ | الْيَتِيمَ | |

تێبینی// تەماشا بکە لامەکە خۆی زەننە(ـْـ)ی لەسەرە و ئەو پیتەی لە پاش لامەکە هاتووە هێمای [سەر یان ژێر یان بۆر]ی لەسەرە، شەددەی لەسەر نیە.

### ٢- لامی شەمسی

ئەو لامەیە کە دەنووسرێت، بەڵام ناخوێندرێتەوە و لامەکە هیچی لەسەر نیە، هەمیشە ئەو پیتەی لە پاش لامەکە دێت شەددەی لەسەرە.

- هەرکاتێک یەکێک لەم پیتانەی خوارەوە بە دوای (لام)دا هاتن، ئەوا (لام)ەکە نا خوێندرێتەوە.

[ ت ، ث ، د ، ذ ، ر ، ز ، س ، ش ، ص ، ض ، ط ، ظ ، ن ، ل ].

- بۆیە پێی دەڵێن لامی شەمسی، چونکە وەکو لامی وشەی (الشَّمْسِ) نا خوێندرێتەوە.

نمونە: الشَّمْسِ بە (ئەششەمس) دەخوێندرێتەوە،

واتا لامەکە ناخوێندرێتەوە، بەڵام ئەگەر وشەیەک یان پیتێکی لەپێشەوە هات ئەوا هەمزەی وەسڵ (گەیاندن) و لامەکەش هیچیان ناخوێندرێنەوە.

نمونە: وَالشَّمْسِ بە (وەششەمس) دەخوێندرێتەوە.



الشَّمْسِ　التَّرَابِ　الثَّاقِبُ　الدُّنْيَا　الذِّكْرَى

الرُّوحُ　الزَّيْتُونِ　السَّمَاوَاتِ　الصُّحُفُ　الصُّورِ

الضَّالِّينَ　الطَّارِقِ　النَّاسِ　اللَّيْلَ

تێبینی// تەماشا بکە لامەکە خۆی هیچی لەسەر نیە ئەو پیتانەی لە پاش لامەکە هاتوون هێمای شەددەیان لەسەرە، (پێچەوانەی پیتەکانی لامی قەمەری).

## چەند تێبینییەک دەربارەی

## وەستان لەسەر کۆتایی وشە و ئایەتەکان

١- لەکاتی وەستان لەسەر ئەو وشانەی کە پیتی کۆتاییان یەکێک لە جوڵەکانی (فەتحە یان کەسرە یان ضەممە) واتا (سەر یان ژێر یان بۆر)یان هەیە، ئەوا جوڵەکانیان ناخوێندرێنەوە و دەکرێن بە سوکون (زەنە).

**نمونە:**

تَعْلَمُونَ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: تَعْلَمُونْ.

مَلِكِ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: مَلِكْ.

يَعْلَمُ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: يَعْلَمْ.

٢- لەکاتی وەستان لەسەر ئەو وشانەی پیتی کۆتاییان (تنوینی الكسرة یان تەنوینی الضمة) واتا (دوژێر یان دووبۆر) یان هەیە، بە هەمان شێوە دەکرێن بە سوکون (زەنە). **نمونە:**

عَذَابٍ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: عَذَابْ.

طَعَامٌ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: طَعَامْ.

٣- لەکاتی وەستان لەسەر ئەو وشانەی پیتی کۆتاییان (تنوینی الفتحة) واتا (دووسەر) یان هەیە، تەنوینەکە دەبێت بە (ئەلیف).

**نمونە:**

مَاءً ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: مَاءَا.

طُوًى ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: طُوَا.

كِرَامًا ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: كِرَامَا.

٤- لەکاتی وەستان لەسەر ئەو وشانەی بە پیتی (ة) کۆتاییان هاتووە، پیتی (ة) دەبێت بە (هـ) و جوڵەکەشیان نامێنێت.

**نمونە:**

زَبَانِيَةَ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: زَبَانِيَه.

حُطَمَةِ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: حُطَمَه.

مُوقَدَةُ ⇐ ئەگەر لەسەری بوەستی دەبێت بە: مُوقَدَه.

# بانگ
# دەستنوێژ - نوێژ







# بانگدان

[illegible]

خودا گەورەترینە (خودا لە هەموو شتێک گەورەترە)

[illegible]

گەواهی (شەهادەت) دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە ئیلا الله نەبێت

أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّه أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللَّه

گەواهی (شەهادەت) دەدەم کە (موحەممەد) پێغەمبەری خودایە

حَيَّ عَلَى الصَّلاة حَيَّ عَلَى الصَّلاة

وەرن بەرەو نوێژ

حَيَّ عَلَى الفَلاح حَيَّ عَلَى الفَلاح

وەرن بەرەو ڕزگاری و سەرکەوتن و سەرفرازی

اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَر

خودا گەورەترینە (خودا لە هەموو شتێک گەورەترە)

لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه

هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە ئیللا الله نەبێت

## وەڵامدانەوەی بانگبێژ

- سوننەتە بانگ بێژ هەرچی ووت تۆش بیڵێیتەوە»

- دوای شایەتومانی بانگێژ دەڵێی:

( [illegible]

رَبًّـا وَبِالْإِسْـلَامِ دِينًـا وَبِمُحَمَّـدٍ رَسُـولًا ).

هەر کەسێ کە گوێ ی لە بانگ بێژ بوو بیڵێ خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ. مسلم ۲۹۰/۱.ابن خزیمە ۲۲۰/۱.

- کاتێک بانگبێژ وتی:

( [illegible] – حَيَّ عَلَى الفَلاحِ) بڵێ ی : ( [illegible] ).

هەر کەس ئاوا لە دڵییەوە بیڵێ دەچێتە بەهەشتەوە. البخری ۱۵۲/۱ ومسلم ۲۸۸/۱.

## دوای بانگ

دوای وەلام دانەوەی بانگ بێژ صلاوات بدە لەسەر پێغەمبەر(ﷺ). مسلم ٢٨٨/١.
(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّد).

پاشان بڵێ: ( [illegible]
وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ).

واتە: خوایە ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواو و نوێژە دامەزراوە، پلەی بەرزی ( [illegible] ) ببەخشە بە پێغەمبەرمان محمد(ﷺ)، ( [illegible] ) ( [illegible] [illegible] )، وە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( [illegible] )، وە ( [illegible] ) کە پلەیەکی زیادیە بەسەر دروست کراواندا.

وە بیبە ئەو شوێنە سوپاس کراوەی کە بەڵێنت پێ داوە (کە پلەی شەفاعەتی گەورەیە لە ڕۆژی دوایی دا).

- هەر کەسێك ئەم پاڕانەوەیە بڵێ کاتێ بانگ دەبیستێ بەر شەفاعەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەکەوێت. البخاری ١٥٢/١

- بپاڕێرەوە بۆ خۆت لەنێوان بانگ و قامەت دا، چونکە پاڕانەوەی ئەو کاتە ڕەت ناکرێتەوە. رواه البخاری ٥١٧/٢٤٤/٨، وانظر صحیح ابو داود (٤٨٩).

## فەزڵی بانگدان

١- بانگ بێژ لە ڕۆژی دوایی دا لە هەموو کەسێك گەردن و ملی بەرزتر و درێژترە. مسلم ٣٨٧ عن معاویە.

٢- وە هەموو شتێك لە مرۆڤ و جنۆکەو شتی تر شایەتی بۆ دەدەن لە ڕۆژی دوایی دا. البخاری ٧٢/٢، ٧٣.

٣- هەر موسڵمانێك (١٢) ساڵ بانگ بدات (بەبێ بەرانبەر) ئەوا بەهەشتی بۆ واجب دەبێ و بە هەموو بانگێك لە ڕۆژێکدا (٦٠) چاکەو بە هەموو قامەتێك (٣٠) چاکەی دەست گیر دەبێ.

# قامەت کردن

ئیقامەت: واتا هەڵساندنەوە.

## چۆنییەتیی قامەت کردن و شێوازی وتنەکەی:

قامەت (یازدە) ڕستەیە، ئەویش قامەتی (بیلال)ە(ﷺ) لە ژێردەستی پێغەمبەر(ﷺ) بەم شێوەیە قامەتی کردووە لەسەفەر و لەناوشاردا:

اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ

خودا گەورەترینە (خودا لە هەموو شتێک گەورەترە)

أَشْهَدُ أَن لا إِلَهَ إِلَّا اللهُ

گەواهی (شەهادەت) دەدەم هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە ئیلا الله نەبێت

أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ

گەواهی (شەهادەت) دەدەم کە (موحەممەد) پێغەمبەری خودایە

حَيَّ عَلَى الصَّلَاةِ

وەرن بەرەو نوێژ

حَيَّ عَلَى الْفَلَاحِ

وەرن بەرەو ڕزگاری و سەرکەوتن و سەرفرازی

قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلَاة

نوێژ نزیکبوویەوە

اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَر

خودا گەورەترینە (خودا لە هەموو شتێک گەورەترە)

لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ

هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە ئیللا الله نەبێت

## نزای چوونە سەرئاو (ئاودەست)



قاچی چەپم پێش دەخەم و دەڵێم:

بِسْمِ اللَّه، اللَّهُمَّ إِنِّ أَعُوذُ بِكَ
مِنَ الخُبُثِ والخبائِثِ

(بە ناوی خودا، خودایە پەنات پێ دەگرم لە شەیتانی نێر و مێ.)

## نزای دەرچوون لە سەرئاو (ئاوددست)




قاچی ڕاستم پێش دەخەم و دەڵێم:

غُفْرانَكَ

خودایە داوای لێخۆشبوون هەر لە تۆ دەکەین

# دەستنوێژگرتن

١- نیەت هێنان: کاتێك ویستت دەستنوێژ بگریت لە دڵی خۆتدا نیەتی دەستنوێژگرتن بهێنە.

٢- بڵێ: ( بِسْمِ اللَّه ).

٣- شوشتنی هەردوو دەست: هەردوو دەستت تاکو مەچەکت سێ جار بشۆ، لەگەڵ بەینی پەنجەکانت.



**٤- ئاو لە دەم وەردان:**

(سێ جار) بە دەستی ڕاست ئاو لە دەمت(زار)ت وەردەدەیت و فڕێی دەدەیتەوە، ئەم کردارەش پێی دەڵێن: ( المضمضة ).



### ٥- ئاو لە لوت وەردان:

لوتت پاک بکەرەوە و سێ جار بە دەستی ڕاستت ئاو بکەرە لوتتەوە و پاشان بە دەستی چەپت فڕێی بدەرەوە، ئەم کردارەش پێی دەڵێن: ( الاستنشاق ).



### ٦- شوشتنی هەموو ڕوخسار:

(سێ جار) ڕوخسارت (دەم و چاوت) بشۆ لە شوێنی ( ڕوانی مووی سەرەوە تا ژێر چەناگە ) و لە (نەرمەی گوێی ڕاستەوە بۆ نەرمەی گوێی چەپ).

(إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ) [ المائدة ٦].

واتا: (کاتێك هەستان بۆ نوێژکردن ڕوخسارتان بشۆن). (تەفسیری ئاسان).



٧- شوشتنی هەردوو باسکت تا ئانیشکەکانت:

(وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ). [المائدة: ٦].

(باسکەکانتان تاوەکو ئانیشکەکانتان بشۆن).

یەکەم جار باسکی ڕاستت (سێ جار) بشۆ پاشان باسکی چەپت (سێ جار).



### ٨- دەستهێنان بەسەر هەموو سەردا (مەسحی سەر):

دوای شوشتنی باسکەکانت، دووبارە دەستت تەڕ دەکەیت و دەستت بەسەر هەموو سەرندا دەهێنیت لە پێشەوەی سەرتەوە بۆ دواوەی سەرت پاشان لە پشتی سەرتەوە بۆ پێشەوەی سەرت.

(وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ). [المائدة: ٦].

واتا: (وە دەستی تەڕ بهێنن بە سەرتاندا). (پوختەی تەفسیری قورئان).



## ٩- دەستهێنان بە دیوی دەرەوە و ناوەوەی گوێ(گوێچکە)دا:

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ( [illegible] ). [الترمذي: ٣٨. ابن ماجه: ٤٤٣، «السلسلة الصحيحة: ٣٦» ].

واتا: (هەردوو گوێ بەشێکن لە سەر).

دەستت تەڕ بکە و پەنجەی شایەتومان بە دیوی ناوەوەی گوێیەکانت (گوێچکەکانت)دا بێنە و پەنجەی گەورەت بەدیوی دەرەوەی گوێچکەکانتدا بێنە.



## ١٠- شوشتنی هەردوو پێیەکانت تاکو قولە پێکانت (گوێزینگەکانت):

- لە پێی ڕاستت دەست پێبکە و سێ جار بیشۆ پاشان پێی چەپت سێ جار بشۆ، هەروەها نێوانی پەنجەکانت جوان بشۆ.

(وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ). [المائدة: ٦].

(وە هەردوو پێیەکانیشتان تاوەکو قولە پێکانتان بشۆن).



## ئەو شتانەی دەستنوێژ دەشکێنن

١) (میز و پیسایی) کردن و (ب) لێبوونەوە، هەرشتێک لە دەرچەکانی پێش و پاشی مرۆڤ بێتە دەرەوە.

٢) شتێك ببێتە قەتماغە لەسەر پێست، وەك مۆم یان بۆیەی نینۆك، یان هەر شتێکی تری هاوشێوە، یان هەر شتێک ڕێگر بێت لە تەڕ بوون.

٣) نووستنێکی قوڵ.

٤) لەهۆش خۆ چوون.

٥) شێت بوون و لەدەستدانی عەقڵ.

٦) دەستدان لە هەندێک ئەندامی جەستە.

## تەیەممو م

ئەگەر ئاوت دەست نەکەوت بۆ دەستنوێژگرتن یان خۆشوشتن یان بەهۆی (نەخۆشییەک یان شکانێک یان برینێک) نەتتوانی دەستنوێژ بگری، ئەوا تەیەممو م بکە، لەبری دەستنوێژگرتن یان خۆشوشتن.

### - حوکمی تەیەمموم کردن ئەگەر ئاوت دەست نەکەوت؟

وەڵام: دروستە تەیەمموم بکرێت ئەگەر ئاو دەست نەکەوێ.

**بەڵگە:**

١- خوای گەورە دەفەرمووێت: (فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا) [المائدة: ٦].

(ئاوتان دەست نەدەکەوت (بۆ خۆشوشتن و دەست نوێژ گرتن) ئەوا تەیەمموم بکەن بە (خۆڵ) خاکێکی پاک.

٢- پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: (دروستە تەیەمموم بکرێت ئەگەر ئاو نەبوو، بە بەڵگەی قورئان و فەرموودەی صحیح و ئیجماع). المجموع (٢/٢٦١).

- **ئەو شتانەی تەیەمومیان پێ دەکرێت:**

گڵێکـی خاوێـن، یـان بـە هـەر شـتێک کـە لـە ڕەگـەزی زەوی بێـت ، وەک لم و بەرد و گەچ.

- **چۆنیەتی تەیەموم کردن:**

ئەو کەسەی تەیەمموم دەکات پێویستە لەسەری لە پێشدا لە دڵیدا نیەت بهێنێ.

پاشـان (بِسْمِ اللَّه) بـکات ، ئینجـا هـەردوو دەسـتی بکێشـێ بەڕووی زەوی پاکـدا و پاشـان دەم و چـاوو هـەردوو دەسـتی هەتـا مەچەکی(بازنـی دەسـتی) دەسـتی پێـدا بهێنێـت بـکات.









# نوێژ

## ١- نوێژ چییە؟



نوێژ: پەرستشێکە لە چەند وتە و کردارێك پێکدێت، بە تەکبیر(اللَّهُ أَكۡبَر) دەستپێدەکات و بە سڵاودانەوە کۆتایی پێدێت، ڕۆژانە (٥ جار) نوێژ ئەنجام دەدرێت.
(٣ ساڵ) پێش کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککەوە بۆ مەدینە لەسەر موسوڵمانان فەرزکرا.

## ٢- خۆ پاککردنەوە پێش نوێژکردن:

أ- دەستنوێژ بگرە، (کاتێك دەستنوێژت نەبوو).
ب- خۆت بشۆ، ئەگەر (پێویستت بە خۆشوشتن بوو)، بەڵام ئەگەر ئاوت دەست نەکەوت، یان بەکارهێنانی زیانت پێبگەیەنێت تەیەممووم بکە.

## ٣- پاککردنەوەی جل و بەرگ و جێگەی نوێژکردن:

جل و وبەرگ و جێگای نوێژەکەت پاکبکەرەوە.

**بەڵگە:**

(وَثِيَابَكَ فَطَهِّرۡ)-(پۆشاکەکەت خاوێن ڕابگرە)(المدثر:٤).



پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: ( ... من الماء)[الدارقطني: ٤٥٣ ، صححه الالباني الإرواء:٢٨٠].
کاتێك دەشتەکییەك لە مزگەوت میزی کرد-
پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سەتڵێك ئاوی پێدا بڕێژن).



### ٤- ڕوو کردنە قیبلە:

ڕوو بکـەرە قیبلـە ئـەو شـوێنەی کـە موسـوڵمانان لـە کاتی نوێـژدا ڕووی تێدەکـەن کـە بریتییـە لـە کەعبـەی پیـرۆز بەبـێ ڕوو وەرگێـڕان.

**بەڵگە**

(فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ) (البقرة ١٤٩).

(ڕوو بکەرە کەعبەی پیرۆز). (تەفسیری ئاسان).

پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێـت: ( [illegible] ) [البخاري٦٢٥١، مسلم٣٩٧]. (کاتێـك ویسـتت نوێژبکەیـت بەجوانـی دەسـتنوێژ بگـرە، پاشـان ڕوو بکـەرە قیبلە)



### ٥- نیەت هێنانی نوێژ:

لـە دڵـی خۆتـدا نیەتـی ئـەو نوێـژە بهێنـە کـە دەتەوێـت بیکەیـت.

**بەڵگە:**

( إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ) [البخاری ، مسلم].

(هەموو کردەوەکان بە پێی نیەتەکانیانن).

### ٦- تەکبیر کردن (اللَّهُ أَكْبَرَ):

تەکبیرەی نوێژ دابەستن بکە و بڵێ:

(اللَّهُ أَكْبَرُ).

**بەڵگە:**

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ( [illegible] ). [البخاري٧٩٣، مسلم٣٩٧].

کاتێك ویستت دەست بە نوێژ بکەیت: (اللَّهُ أَكْبَرَ) بکە.

## ٧- دەست بەرزکردنەوە:

لەگەڵ (اللَّهُ أَكْبَر) دەستەکانت بەرز بکەوە بە هەوتای شنت یان گوێچکەت. وە بڕوانە شوێنی سوجدەکەت. وە پێیەکانت بە فراوانی هەردوو شانت بکەرەوە.

**بەڵگە:**

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ([illegible] (ﷺ) [illegible] افْتَتَحَ الصَّلَاةَ). [البخاري ٧٣٨].

([illegible] [مسلم ٤٠١، أبو داود ٩٥٧].

### ٨- دانانی دەست:

لە سەرووی ناوکەوە دەستی ڕاستت دەخەیتە سەر دەستی چەپت.

**بەڵگە:** (وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى) [مسلم ٤٠١].

پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو نوێژ دەستی ڕاستی لەسەر دەستی چەپی دادەنا.

### ٩- خوێندنی یەکێک لە نزاکانی دەسپێکی نوێژ:

نموونە: ((سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ)).

واتا: خودایە پاکی و بێ گەردی و ستایش بۆ تۆیە، وە ناوی تۆ پیرۆزە و فەڕ و بەرەکەتی و زۆرە و دەسەڵات گەورە و بڵندە و هیچ پەرستراوێک نییە بە هەق جگە لە تۆ.

تێبینی// سوننەتە لە دوای تەکبیرەی نوێژ دابەستن و پێش خوێندنی سورەتی (الفاتحة) ئەم نزایە یان یەکێک لە نزاکانی نوێژ دابەستن بخوێنرێت.



**١٠- خوێندنی سوورەتی (الفاتحة):**

أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

پەنا دەگرم بە خودا، لە شەیتانی نەفرەت لێکراو

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان *هەموو سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان * بەخشندەی میهرەبان *

مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ

خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە * خوایە تەنها تۆ دەپەرستین وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین * ڕێنموونیمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست

﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾

* ڕێگای ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردوون نەک (ڕێی) ئەوانەی خەشمی (تۆیان) لێ گیراوە وەنەک (ڕێی) گومڕایان. (پوختەی تەفسیری قورئان).

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: ( [illegible] ) [البخاري ٧٦٥ مسلم ٣٩٤].

(نوێژی ئەو کەسە دروست نییە کە سوورەتی (الفاتحة)ـی تێدا نەخوێنێت).

١١- خوێندنی سوورەتێک یان چەند ئایەتێک لە سوورەتێکی تر لە دوو ڕکاتی سەرەتادا:

بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـٰنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

قُلْ هُوَ اللَّـهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّـهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾

بڵێ: ئەوە خوای تاک و تەنیا * ئەو خوایەی بێ نیاز و جێ ی نیاز و ئومێدە * کەسی لێ نەبووە و لەکەس نەبووە *

وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾

وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوە و هاوتای نی یە *. (پوختەی تەفسیری قورئان).

بەڵگە: ( [illegible] ).[البخاري ٧٢٢ مسلم ٣٩٢].

واتا: (دواتر هێندەی بۆت گونجا لە قورئان بیخوێنە).

## ١٢- ڕكوع بردن:

بڵێ: (اللَّهُ أَكْبَرُ) وه لەگەڵ -اللَّهُ أَكْبَرُ-دا هەردوو دەستەكانت بەرزبكەرەوە، وە پەنجەكانت بە ڕێكی بگرە و بڵاویان مەكەرەوە.

پاشان بچۆرە ڕكوع، پشتت بچەمێنەرەوە، سەرت لە ئاستی پشتت ڕێك ڕابگرە و دەستەكانت لەسەر ئەژنۆت دابنێ و پەنجەكانت بڵاو بكەوە هەر وەك ئەوەی ئەژنۆكانت بگریت.

(٣ جار) بڵێ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيم (وَبِحَمْدِهِ).

واتا: (پاك و بێگەردی بۆ خودای میهرەبان و سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە).



## ١٣- هەستانەوە لە ڕکوع:

کاتێک هەستایتەوە لە ڕکوع، پشتت ڕاست بکەرەوە و جارێکی تر دەستەکانت بەرز بکەرەوە بە هاوتای شانت یان گوێچکەکانت و بڵێ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ). [البخاري ٨٠٤].

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکوع دەستەکانیشی بەرزدەکردەوە)[البخاري ٧٣٥].

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) سەری بەرز دەکردەوە -لە ڕکوع- پشتی ڕاست دەکردەوە هەتاوەکو بڕبڕەکانی پشتی دەگەڕانەوە جێگای خۆیان) [البخاري ٨٢٨].



### ١٤- سوجده بردن:

- دەچیتە سوجدە و لەگەڵیدا دەڵێی: «اللَّهُ أَكْبَرُ».
- دەبێت (حەوت) ئەندامی لاشەت لەسەر زەوی دابنێیت کە ئەمانەن: (نێوچەوان و لوت - هەردوو دەست - هەردوو ئەژنۆ - هەردوو پێ). [البخاري ٨١٢ مسلم ٤٩٠].
- پەنجەکانی دەستت بڵاو مەکەرەوە و ڕوویان بکەرە قیبلە. [البخاري ٨٢٨].
- دەستەکانت لە ئاستی شانت دابنێ یان لە ئاستی گوێچکەکانت.
- ئانیشکت لەسەر زەوی دامەنێ. [مسلم ٤٩٨].
- هەردوو پێیەکانت بەیەکەوە بلکێنە، وە پەنجەکانی پێت ڕوو بکەرە قیبلە.
- (٣ جار) بڵێ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى (وَبِحَمْدِهِ). [ابن ماجه ٨٨٨ «صحيح ابن ماجه ٧٢٥].



١٥- لە دوای سوجدەی یەكەم:

(اللَّهُ أَكْبَرُ) دەڵێی و دادەنیشیت،

پێـی چەپـت ڕادەخـەی و لەسـەری دادەنیشـیت، وە پێی ڕاسـتت دەچەقێنیـت، زەوی و بڵـێ: (رَبِّ اغْفِـرْ لِي رَبِّ اغْفِـرْ لِي)، [صحيح الارواء ٣٣٥ ابن ماجه ٨٨٨].

١٦- جارێكی تر دەڵێی:(اللَّهُ أَكْبَرُ)و سوجدەی(دووەم) دەبەیت:

پاشـان هەڵدەسـتیتەوە و ڕكاتـی دووەم بەهەمـان شـێوەی ڕكاتـی یەكـەم دەخوێنـی، پاشـان دوای دوو سـوجدەی تـر دادەنیشـیت بـۆ خوێندنـی تەحیـات.



### ١٧- خوێندنی تەحیات:

وەکو شێوازی نێوان دوو سوجدەکە دانیشە و تەحیات بخوێنە و بڵێ:

(التَّحِيَّاتُ للهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ. السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ. السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَن لَّا إِلَهَ إِلَّا اللَّه. وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) [البخاري ٨٣١].

(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ)، (كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ. إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) [البخاري ٣٣٧٠].



تێبینی// (لە تەحیاتی نوێژی بەیانیدا ئەم بەشەی تەحیاتیش کە لەدوای (اَللَّهُـمَّ صَـلِّ عَلَى...) دێت دەخوێندرێت، بەڵام لە نوێژی ٣ ڕکاتی و ٤ ڕکاتی تەنیا لە تەحیاتی دووەمدا دەخوێندرێت، لە تەحیاتی یەکەمدا ناخوێندرێت).

ج بۆ ئەوەی بە ئاسانی تەحیات بخوێندرێتەوە و لەبەر بکرێ بە ڕێنووس (إملاء)ی کوردی دەینوسینەوە:

([illegible]
[illegible]
[illegible]
ئەننـە موحەممـەدەن عەبدوهـو وە ڕەسـولوهـ)

([illegible])، کەمـا
صەلللەیتـە عـەلا ئیبراهیـمە وە عـەلا ئالـی ئیبراهیـم ئیننەکـە حەمیـدوە مەجیـد،
ئەڵلاهومـە باریـك عـەلا موحەممەدیـن وە عـەلا ئالـی موحەممـەد، کەمـا
بارەکـتە عـەلا ئیبراهیمـە وە عـەلا ئالـی ئیبراهیـم، ئیننەکـە حەمیـدوە مەجیـد).

## ١٨- کردنی ڕکاتەکانی (٣ و ٤):

لەدوای ئەوەی کە تەحیاتی یەکەم دەخوێنیت لەگەڵ هەستانەوەدا بڵێ: (اللَّهُ أَكْبَرُ).
وە دەستەکانت بەرزبکەوە و ڕکاتی (٣ و ٤) بکە، وەکو ڕکاتەکانی تر.

## ١٩- خوێندنی تەحیاتی کۆتایی:

دوای ئەوەی سوجدەی (دووەم) دەبەیت لە ڕکاتی (چوارەم) دابنیشە بەشێوازی (تەوەڕوك).

* دواتر ئاماژەی پێدەکەین.

وە تەحیات بخوێنە، لە کۆتایی تەحیاتدا ئەم نزایەشی بۆ زیادبکە:

(اللَّهُـمَّ إِنِّي أَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ عَـذَابِ الْقَـبْرِ وَمِـنْ عَـذَابِ النَّـارِ وَمِـنْ فِتْنَـةِ الْمَحْيَـا وَالْمَمَـاتِ وَمِـنْ فِتْنَـةِ الْمَسِـيحِ الدَّجَّـالِ). [البخاري ١٣٧٧ مسلم ٥٨٨].

## * شێوازی دانیشتنی تەوەڕوك:

ئەو نوێژەی دوو تەحیاتی تێدایە، وەك: (نیوەڕۆ - عەسر - ئێوارە - خەوتنان) بە شێوازی دانیشتنی (تەوەڕوك) لە تەحیاتی كۆتاییدا دابنیشە. [البخاري ٨٢٨].

شێوازەكەی: پێی ڕاستت دەچەقێنیت، وە پێی چەپت دەخەیتە ژێر پێ ی ڕاستت.



## ٢٠ چۆنیەتی دانیشتنت لە تەحیات لەو كاتەی كە تەحیات دەخوێنیت:

دەستی ڕاستت لەسەر ڕانی ڕاستت دابنێ ، وە دەستی چەپت لەسەر ڕانی چەپت دابنێ، وە پەنجەكانی دەستی چەپت بە ڕێكی دابنێ و پەنجەكانی دەستی ڕاستت بنوشتێنەوە جگە لە پەنجەی شایەتومان.

كاتێك كە تەحیات دەخوێنیت سەرەتا سەیری شوێنی سەجدە دەكەیت، پاشان كە گەیشتیتە شایەتمان سەیری پەنجەی شایەتمانت دەكەیت و پەنجەی شایەتمان بەرزدەكەیەوە.

## ٢١- سڵاودانەوەی کۆتایی:

لـە دوای ئـەوەی کـە تەحیـاتـی کۆتاییمت خوێنـد سـەرەتا بـەلای ڕاسـتدا سـڵاو بـدەوە و بڵـێ:

(السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).



پاشان بەلای چەپدا سڵاو بدەوە و بڵێ:

(السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).

[مسلم ٤٣١-٤٩٨-٥٨٢].



## ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە:

١) قسەکردن لەکاتی نوێژ.
٢) شت خواردن.
٣) جووڵەی زۆر.
٤) پێکەنینی بە دەنگ.
٥) هەر شتێکیش دەستنوێژ بشکێنێ لەکاتی نوێژدا، نوێژەکەت بەتاڵ دەکاتەوە.

## ئەو شتانەی لەکاتی نوێژدا ناپەسەندە (مکروه)ە بکرێن:

١) تەماشا نەکردنی شوێنی سوجدە.
٢) پەلەکردن لە ئەنجامدانی نوێژ.
٣) تەماشاکردنی ئاسمان، سەر بەرزکردنەوە.
٤) ئاوڕدانەوە.
٥) پەنجە و مل تەقاندن.
٦) هەڵگرتنی شت بەبێ پێویستی.
٧) نوێژ کردن لەو کاتەی خەو بەسەرت دا زاڵ بێ.
٨) باوێشکدان.
٩) خۆدانە سەر لایەک (خۆ خوارکردنەوە).

## ئەو ویردانەی لەدوای نوێژ دەگوترێن

هەر کە نوێژەکەت ئەنجام دا، ئەو ویردانە بخوێنە کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێندوویەتی:



(٣) جار دەڵێی: ( أَسْتَغْفِرُاللَّه ) رواه احمد.

پاشان دەڵێی: ( [illegible]
الجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ) رواه النسائي.

(٣٣) جار دەڵێی : ( سُبْحانَ اللَّه ).

(٣٣) جار دەڵێی : ( الحَمْدُ لله ).

(٣٣) جار دەڵێی : ( اللَّهُ أَكْبَر ).

دواتر (١) جار دەڵێی: (لا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْد، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدير) رواه البخاري.

# هەندێ لە ئادابەکانی

# قوتابی قورئان



# هەندێ لە ئادابەکانی قوتابی قورئان



## ١- ئادابی ڕێزگرتن لە دایک و باوک

١- زۆر باش و چاکەکار دەبم لەگەڵیان و دەستەکانیان ماچ دەکەم و هەرگیز دڵیان نایەشێنم.
٢- زۆر ڕێزیان لێ دەگرم و هەردەم لە کاری چاکەدا گوێڕایەڵیان دەبم و پێویستیەکانیان جێبەجێ دەکەم، وە هەرگیز بە بێ مۆڵەتی ئەوان بۆ هیچ شوێنێك ناڕۆم.
٣- سڵاویان لێ دەکەم لەکاتی دەرچوون و هاتنەوەم بۆ ماڵ، پێشیان ناکەوم لە ڕۆیشتندا.
٤- هەرگیز دەنگم بەرز ناکەمەوە بەسەریاندا و ئۆف و قسەی ناخۆشیش بەرامبەریان ناکەم، هەموو کات نزای خێریان بۆ دەکەم و دەڵێم: (رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً ). واتا: پەروەردگارا ڕەحمیان پێ بکە و میهرەبان بە بۆیان، هەروەکو چۆن ئەوان ڕەحمیان بە من کرد و منیان پەروەردە کردووە بە بچووکی و بە منداڵی.
٥- بە بابە گیان و دایە گیان بانگیان دەکەم و هەرگیز دەنگی خۆم و مۆبایل و تەلەفزیۆن بەسەریاندا بەرز ناکەمەوە.
٦- خۆم دەپارێزم لە هەموو ئەو گوفتار و کار و ڕەفتارانەی دەبنە هۆی ئازاردانیان.
٧- زۆر ڕێزی خزمەکان و هاوڕێکانی دایک و باوکم دەگرم.
٨- پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ڕەزامەندی خودا لە ڕەزامەندی دایک و باوکدایە. تووڕەبوونی خوداش لە تووڕەبوونی دایک و باوکدایە.

### ٢- ئادابەکانی قوتابی لەگەڵ مامۆستاکەیدا



١- پێویستە قوتابی بە چاوی فێرکار و پەروەردەکارەوە سەیری مامۆستاکەی بکات، وای دابنێ مامۆستاکەی پەروەردەکارە و پەروەردەی دەکات و فێرکارە و زانستی فێر دەکات.

٢- پێویستە لەسەر قوتابی گوێڕایەڵی مامۆستاکەی بێت و لە هەموو کارەکانیدا پرس و ڕاوێژی پێ بکات و لە قسەی دەرنەچێت.

٣- ئەرکی قوتابی ئەوەیە کە هەوڵبدات پێش هاتنی مامۆستا ئامادە بێت، خۆی بە دوور بگرێت لەوەی دوا بکەوێت لە دەرسەکەی.

٤- لە ئادابەکانی قوتابی ئەوەیە کە نابێت بە بێ مۆڵەت وەرگرتن بچێتە ژوورەوە بۆ لای مامۆستاکەی، بەڵکو بۆ هەر کارێک پێویستە پرسی پێ بکات.

٥- پێویستە لەسەر قوتابی کە دەچێتە دەرس خوێندن لای مامۆستا، بیر و هۆشی ئامادە بێت و لە حاڵەتی خەواڵوو یان برسی یان تینوو دا نەبێت، دڵی خاڵی بێت لە شتە سەرقاڵکەرەکان، بۆ ئەوەی دڵخۆش بێت بەوەی کە دەگوترێت و تێبگات لەوەی دەیبیستێت.

٦- لە نیشانەکانی ڕێزگرتنی مامۆستا ئەوەیە کە قوتابی بە ئەدەبەوە دانیشێت لەبەردەم مامۆستاکەیدا، نابێت جوڵەی زۆر یان پێبکەنێت و گاڵتە بکات، بەڵکو دەبێ بە هەموو ئەندامەکانیەوە ڕوو لە مامۆستا بکات و گوێی لێ بگرێت.

٧- هەرکاتێک قوتابی لەگەڵ مامۆستاکەیدا ڕێی کرد، هەرگیز نابێت پێش مامۆستاکەی بکەوێت، بەڵکو لە تەنیشتیەوە یاخود لە دوایەوە بڕوات.

٨- پێویستە لەسەر قوتابی چاکەکار بێت لەگەڵ مامۆستاکەیدا و سەردانی بکات و هەمیشە لە خزمەتکردنی مامۆستاکەی بەردەوام بێت، هەرگیز پەیوەندی چاکەکردن لەگەڵ مامۆستاکەیدا نەپچڕێنێت تا کۆتایی ژیانی.

٩- پێویستە لەسەر قوتابی تا مامۆستاکەی لە ژیاندایە دوعای خێری بۆ بکات، دوای مردنی مامۆستاکەشی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات و چاکەی بۆ بکات.

## ٣- ئادابی نوستن




١- هەوڵ دەدەم لە دوای نوێژی عیشا بخەوم، مەگەر کاتێک خەریکی زانست بم، یان لە لای میوان دابنیشم.

٢- هەوڵ دەدەم هەموو شەوێک بە دەستنوێژەوە بخەوم.

٣- لەسەر لای ڕاستم دەخەوم نەک لەسەر سک و پشت و لای چەپ.

٤- پێش ئەوەی بخەوم (آیة الکرسي) و سورەتەکانی ( قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ) و ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ) سێ جار دەخوێنم، پاشان نزا دەکەم و دەڵێم: ( ). واتا: (بەناوی تۆوە پەروەردگارا دەمرم و زیندوودەبمەوە).

پاشان سێ جاریش دەڵێم: ( ).

واتە: پەروەردگارا لە سزای خۆت بمپارێزە، لەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

٥- کاتێکیش بەخەبەرهاتم سوپاسی خوا دەکەم و دەڵێم:

( الحَمدُ للهِ الذى أَحيَانَا بَعدَ مَا أَمَاتَنَا وَ إِلَيهِ النُّشُور ).

واتا: (سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە، دوای ئەوەی مراندینی و گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای ئەوە).

## ٤- ئادابی سڵاوکردن



١- سڵاوکردن سوننەتە، بەڵام وەڵامدانەوەی سڵاو واجبە.

٢- بە ڕوویەکی خۆش و گەشەوە سڵاو لە ماڵ و کەسوکارم و هەر موسڵمانێک دەکەم و پێی دەڵێم: ( السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ ).

ئەگەر کەسێکیش سڵاوی لێکردم بە ڕوویەکی خۆش و گەشەوە وەڵامی دەدەمەوە و دەڵێم: ( وَعَلَيكُمُ السَّلامُ وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ ).

٣- دەبێت بزانین کەسی سوار دەبێ سڵاو لە کەسی پیادە بکات، وە دەبێت پیادەش سڵاو لە دانیشتوو بکات، وە دەبێ خەڵکێکی کەم یەکەم جار سڵاو بکەن لە خەڵکێکی زۆر، وە ئێمەی منداڵیش دەبێ یەکەم جار سڵاو بکەین لە گەورەکان.

٤- هەرگیز کەمتەرخەم و سارد و سڕ نابم لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا کە سڵاوم لێدەکەن، بەڵکو زۆر ڕێزیان لێدەگرم و بەجوانترین شێوە وەڵامی سڵاویان دەدەمەوە.

٥- لە شەودا بە دەنگی نزم سڵاو دەکەم، واتا: هەرکاتێک کەسێک خەوتبوو سڵاو بەدەنگی نزم دەکەم لەکەسانی تر.

٦- سڵاو لەو کەسانە ناکەم کە: (کەسی خەوتوو- کەسێک دەستنوێژ بگرێت یان نوێژ بکات-کەسێک قورئان بخوێنێت-کەسێک نان بخوات و پاروی لە دەمدا بێت، دواتر سڵاویان لێ دەکەم.

٧- ئەگەر سڵاوت کرد و وەڵام نەدرایەوە، دڵتەنگ مەبە، بڵێ لەوانەیە ئاگای لێنە بێت .

٨- کاتێک دەگەڕێمەوە ماڵەوە سڵاو دەکەم.

## ٥- ئادابی قورئانخوێن و قورئانخوێندن



١- کاتێک ویستم قورئانی پیرۆز بخوێنم دەستنوێژ دەگرم و زۆر بە ڕێزەوە قورئانەکە دەگرم و لەسەر کۆشم یان لەسەر شتێک دایدەنێم، هەرگیز لەسەر زەوی دایینانێم.

٢- لە شوێنێکی پاکو ڕووەو قیبلە دادەنیشم، سیواک بەکاردەهێنم پێش قورئانخوێندن.

٣- بەدەنگێکی خۆش و بە لەسەرخۆیی قورئان دەخوێنم و پەلەپەل ناکەم.

٤- لەواتای ئایەتەکان ڕادەمێنم و هەوڵ دەدەم کار بە فەرمانەکانی بکەم و خۆشم لە قەدەغەکراوەکانی بپارێزم.

٥- کاتێ کە قورئانم خوێند تەنها لەبەر خوا دەیخوێنم و لەبەرامبەر خوێندنی پارە و کرێ لە هیچ کەس داوا ناکەم، خۆم دەپارێزم لە ڕووپامایی(الرياء).

٦- کاتێ گوێم لە قورئان خوێندن بوو دەنگەدەنگ ناکەم و زۆر بەچاکی گوێی بۆ ڕادەگرم.

٧- ئەگەر لەشم پاك نەبوو یان دەستنوێژم نەبوو ئەوا قورئان هەڵناگرم و دەستی بۆ نابەم.

٨- ئەگەر باوێشک یان پژمینم هات دەوەستم، دوایی دەست بە قورئانخوێندن دەکەمەوە.

٩- گوێگرتن لە قورئان ڕۆژانە لە: مۆبایل-کاسێت-ڕادیۆ- تەلەفزیۆن- یان هەر ئامێرێکی تر.

١٠- ئافرەتان خۆیان داپۆشن و لەچک بکەن.



## ٦- ئادابی چوونە مزگـەوت

تێبینی// پێویستە لەسەر مامۆستا گرنگییەکی زۆر بەم ئادابە بدات و زۆر بە جوانی بۆ قوتابی ڕوون بکاتەوە.

١- جلی جوان و پاک لەبەر دەکەم و قژم شانە دەکەم و خۆم بۆن خۆش دەکەم.

٢- زوو دەڕۆم بۆ مزگەوت و بە دەستنوێژەوە دەچمە مزگەوت.

٣- کاتی چوونە ژورەوە قاچی ڕاستم پێش دەخەم و دەڵێم:

( [illegible] ). رواه مسلم.

واتا: ( بەناوی خودا، درووود و سڵاوی خودا لەسەر پێغەمبەری خودا (ﷺ)، پەروەردگارا دەرگاکانی سۆز و بەزەیتم لێ بکەرەوە ).

٤- دانانیشم تاکو دوو ڕکات نوێژ نەکەم.

٥- سیواک دەکەم.

٦- کاتێک دوو ڕکات نوێژم کرد لە شوێنی خۆم دادەنیشم تاکو قامەت دەکرێت بۆ نوێژ.

٧- هەرگیز بە بەردەمی نوێژ خوێنەکاندا ناڕۆم و هەنگاو بەسەر شانیاندا هەڵنانێم.

٨- قسەی بێ سود ناکەم، ئەگەر قسەشم کرد زۆر بە هێمنی قسە دەکەم و دەنگم بەرزناکەمەوە.

٩- خۆم بە یادی خواوە خەریک دەکەم و نزا دەکەم لە نێوان بانگ و قامەتدا.

١٠- کڕین و فرۆشتن لەناو مزگەوتدا ناکەم.

١١- نابێت بۆنی ناخۆشمان لێبێت وەک: بۆنی سیر و پیاز و گۆرەوی... هتد.

١٢- مزگەوت پیس ناکەم و بە پاک و خاوێنی ڕایدەگرم.

١٣- بەردەوام ڕێز لە نوێژ خوێنان دەگرم بەتایبەتی مامۆستای مزگەوت.

١٤- وەڵامی مۆبایل نادەمەوە لەناو مزگەوت و مۆبایلەکەم بێ دەنگ دەکەم.

١٥- کاتێکیش ویستم بێمە دەرەوە قاچ(لاق)ی چەپم پێش دەخەم و دەڵێم:

( بِسْمِ اللَّهِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ ). ابن ماجه.
واتا: ( بەناوی خودا، درووود و سڵاوی خودا لەسەر پێغەمبەری خودا(ﷺ)، پەروەردگارا دەرگاکانی بەخششی خۆتم لێ بکەرەوە ).

## ٧- ئادابی ئاوخواردنەوە




١- بە دانیشتنەوە و بە دەستی ڕاست و بە سێ جار ئاو بخۆرەوە، لە نێوانیاندا هەناسە بدە لە دەرەوەی پەرداخەکە.

٢- وتنی (بسم الله) لە سەرەتادا، وە وتنی (الحمدلله) لە کۆتایدا.

٣- ئەوەندە ئاو بکەرە ناو پەرداخەکەوە کە بۆت دەخورێتەوە.

٤- پەرداخێک درزی تێدابوو یان شکابوو ئاوی تێدا مەخۆرەوە.

٥- ئاوت دابەشکرد لە گەورەوە دەست پێبکە، پاشان لەلای ڕاستی گەورەکەوە، خۆت کۆتا کەس ئاو بخۆرەوە.

٦- پێش خەوتن یەک پەرداخ ئاو بخۆرەوە، لە بەیانیاندا (١-٢) پەرداخ ئاو پێش نان خواردن بخۆرەوە.

## ٨- ئادابی نانخواردن




١- هەردوو دەستت لە پێش و دوای نان خواردن پاک بشۆ.

٢- وتنی ( بِسْمِ اللّٰهِ ) لە سەرەتادا، هەرکاتێک بیرت کەوتەوە بڵێ: ( بِسْمِ اللّٰهِ فِي أَوَّلِهِ وَ آخِرِه).

٣- بەدەستی ڕاستت نان بخۆ، لەبەردەم خۆتەوە بخۆ.

٤- پێویستت بە شتێک بوو بە هێمنی داوای بکە.

٥- خواردنێکت بە دڵ نەبوو هیچ قسە مەکە و بە بێ دەنگی دەست هەڵگرە لە خواردن.

٦- باسی شتی قێزەون مەکە لە کاتی نان خواردندا.

٧- ئەوەی لە دەستت کەوتە خوارەوە پاکی بکەوە و بیخۆ، فوی پێدا مەکە.

٨- کاتێک کەسی گەورە دەستی پێکرد ئینجا تۆش دەست پێ بکە.

٩- لەکاتی نان خواردنی میوانەکاندا تەماشایان مەکە.

١٠- بەڕاکشانەوە نان مەخۆ.

١١- ڕاستەوخۆ لەدوای نان خواردن پاڵمەکەوە و مەخەوە.

١٢- کەسێک بانگهێشتی کردیت بچۆ بەدەم بانگهێشتەکەیەوە.

١٣- لەکۆتایدا بڵێ: ( [illegible] ).

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەم خواردنەی پێدام بەبێ هیچ هێز و توانایەکی من ڕزق و ڕۆزیمی دا.

١٤- لەدوای نانخواردن بەردەمی خۆت پاکبکەرەوە و پیسیی جێمەهێڵە.

## ٩- ئادابی چونه سەرئاو

١- پێش ئەوەی بچمە ژوورەوە دەڵێم:(اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ).البخاري و مسلم.

واتە: (پەروەردگارا پەنات پێدەگرم لە خراپە و پیسی شەیتانە نێرو مێکان).

پاشان قاچ(لاق)ی چەپم پێش دەخەم و دەچمە ژوورەوە.



٢- ئەگەر شتێکم پێبوو ناوی خودای تێدا بوو لەگەڵ خۆم نایبەمە ژورەوە، مۆبایل با قورئانیشی تێدا بێت ئاساییە بیبەمە سەرئاویش.

٣- بەچاکی دەوروبەرم دادەپۆشم و دەرگا دادەخەم و ناهێڵم کەس چاوی لێم بێت.

٤- هەرگیز لەسەر ئاودا وەڵامی بانگ نادەمەوە و قسە ناکەم، مەگەر زۆر پێویست بێت.




٥- هەرگیز بە پێوە میز ناکەم و ناو سەر ئاوەکە بە پاکو خاوێنی ڕادەگرم و پیسی ناکەم.

٦- دەستی ڕاستم بەکاردەهێنم بۆ دەرگا کردنەوە و بەلوعە کردنەوە و مەسینە گرتن.

٧- دەستی چەپ بەکاردەهێنم بۆ خۆ پاککردنەوە.

٨- کاتێکیش هاتمە دەرەوە قاچی ڕاستم پێش دەخەم و دێمە دەرەوە و دەڵێم:

( غُفْرَانَكَ ) ابوداود وابن ماجه.

واتە: ( پەروەردگارا لێمخۆشبە ).

٩- پاشان بەر لەوەی دەست بۆ هیچ شتێک ببەم دەستەکانم زۆر بەپاکی بە ئاو سابوون دەشۆم.

چەند زانیارییەک دەربارەی

# قورئانی پیرۆز



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

## چەند زانیارییەک دەربارەی قورئانی پیرۆز

### - پێناسەی قورئان:

قورئان وتەی خودای گەورەیە، لە ڕێگای جیبریلەوە کە فریشتەیەکی خوای گەورەیە(تایبەتە بە دابەزاندنی وەحی) دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەرمان (موحەممەد(ﷺ))، دوا پەیامی ئاسمانیە بۆ مرۆڤەکان ڕەوان کراوە و هیچ پەیامێکی تر دوای ئەو نیە، بۆ ئەوەی لە تاریکی و نەفامیەوە دەریانبهێنێ بۆ ڕوناکی و زانست و زانیاری، قورئان بەرنامەیەکی گشتگیرە، دەرمانی هەموو دەردێکی تێدایە، یاسای هەموو ژیانی تێدایە، هەواڵی گەلەکانی پێشووی داوە و لە زیانی داهاتوومانی ئاگادار کردووینەتەوە، باسی دونیا و دوارۆژی کردووە، هەر کەسێک کاری پێ بکات دادپەروەری کردووە و پاداشتی بۆ هەیە، ئەو کەسەی وەکو نزا بەکاری بهێنێ وەڵامی دەدرێتەوە، قورئان ڕۆشناییە بۆ دڵەکان و ئارامییە بۆ ڕۆحەکان، بەهاری سینەیە و لابەری خەمەکانە و تکاکاری ڕۆژی دواییە، خوێندنەوەی پەرستشە.

### - دابەزینی قورئان

- قورئانی پیرۆز لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزدا دابەزیوە: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ....﴾ (البقرة: ١٨٥).

لەیەکێک لە دە شەوە پیرۆزەکاندا دابەزیوە، ئەو شەوەش لە قورئانی پیرۆزدا بە (لیلة القدر) هاتووە: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ (القدر).

- پێغەمبەر(ﷺ) تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو، ساڵی (٦١٠) زاینی بوو، کاتێک قورئانی پیرۆزی بۆ دابەزی.

- بۆ یەکەم جار کە سروش(وحي) بۆ پێغەمبەر(ﷺ)هات، ئەم پێنج ئایەتەی سورەتی( العلق ) بوو، کە خودای گەورە دەفەرموێ:

﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۝ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۝ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۝ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۝ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝﴾ (العلق).

دەربارەی کۆتا ئایەت کە دابەزی زانایان ڕا جیاییان هەیە، بەڵام ڕای بەهێز ئەوەیە کە کۆتا ئایەت کە دابەزی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوو:

(( ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ )) (المائدة:٣).

ئەوەش پێش (٩) ڕۆژ لەوەفاتی پێغەمبەر(ﷺ) بوو.

## گەورەیی و پاداشتی فێربوونی قورئان و فێرکردنی:

- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (( [illegible] )) رواه البخاري.

واتا: ( باشترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان بێت و خەڵکیش فێر بکات).

- هەروەها فەرمویەتی:



((إنَّ للهِ أهلينَ منَ النّاس، قالوا يا رسول الله(ﷺ): من هم، قال: هم أهلُ القرآن أهل الله وخاصته)) سنن إبن ماجه، وصححه الألباني.

واتە: خودا لەناو خەڵکیدا دۆستی هەیە، گوتیان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟

فەرمووی: ئەوانە قورئان خوێنەکانن، دۆست و هەڵبژێردراوی خودان.

- هەروەها فەرمویەتی: (( [illegible] ))

رواه المسلم.

واتە: قورئان بخوێنن چونکە قورئان لە ڕۆژی دواییدا دەبێت بە تکاکار بۆ خاوەنەکەی.

- هەروەها پێغەمبەری پێشەوامان(ﷺ) دەفەرموێ: (( [illegible] ))

رواه البخاري و المسلم.

و تـه: ئەوكەسـەی کەقورئـان دەخوێنـێ و لێـی شـارەزایە (بەئاسـانی دەیخوێنـێ، بەبـێ وەسـتان و لـێ تێکچـوون)، لەگـەڵ ئـەو فریشـتە بەڕێـز و چاکەکارانەدایـە کـە دەنێردرێـن بـۆلای پێغەمبـەران. وە ئەو کەسـەش کـە قورئان دەخوێنـی و زمانی تەتەڵـە دەکات تێیـدا و لەسـەری زەحمەتـە ئـەوە دوو پاداشـتی بۆهەیـە.

- هەروەهـا فەرمویەتـی: (( [illegible]

اللّٰه فيمنْ عِنده )) رواه المسلم.

واتـە: هـەر کۆمەڵێـک کۆببنـەوە لەماڵێک لەماڵەکانی خـودا و قورئـان بخوێننەوەو لـە نێـوان خۆیانـدا هەوڵـی فێربوونـی بـدەن، ئـەوا بێگومـان ئارامـی دادەبەزێـت بەسـەریاندا وە ڕەحمـەت دایـان دەپۆشـێت و فریشـتەکان چواردەوریـان دەدەن و خـودای گـەورەش باسیان دەکات لای ئەوانـەی کـە لای ئـەون.

- هەروەهـا فەرمویەتـی: (( [illegible]

)) المعجم الكبير للطبراني.

واتە: قورئان فێربن و بیخوێننەوە، چونکە پاداشتی هەر پیتێک (١٠) چاکەیە من ناڵێم (الم) پیتێکە، بەڵکو (الف و لام و میم) سی(٣٠) چاکەیە چونکە خودای گەورە دەفەرموێ هەرکەس چاکەیەک بکات دە(١٠) ئەوەندەی چاکەکەی پاداشتی هەیە.

## - دەنگ خۆش کردن لە کاتی قورئان خوێندندا:

- پێغەمبـەر(ﷺ) دەفەرموێت: ( [illegible]

القُرآن حسناً). رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة والحاكم وصححه الألباني.

واتـە: قورئـان بڕازێننـەوە بـە دەنگەکانتـان، بێگومـان دەنگـی خۆش جوانـی زیاتـر دەبەخشـێت بـە قورئـان.

- هەروەها دەفەرموێت: (( [illegible] )). أخرجه البحاري ٧٥٢٧.

واتە: لە ئێمە نییە ئەو کەسەی بە ئاوازی خۆش قورئان نەخوێنێت.

